دەمـــەوێت لـــەم بەیەکگەیـــشتەنەوەیەدا ئـــەم چـــەند بیرخستنەوەیەتان پێشکەش بکەم (الدین النصیحة) :
هەمو کارێکی بەڕواڵەت خێر مەرج نیە لای خوای متعال (خێر) بێت.. کاتێك لای خوای مەزن بەخێر دەنوسرێت کە ئەم مەرجانەی خوارەوەی تیادا بێت:
* بکەری ئەو کارە دەبێت (یەکخواناس – موحد) بێت.
* بکەری ئەو کارە دەبێت نیەتی رەزامەندی خوا بێت.
*هۆکاری ئەنجامـدان و گەیانـدنی ئـەو کـارە دەبێـت ڕێگا پێدراو بێت. . واتە (مباح)بێت.
بیرتان دەخەمەوە کە ئەنجامدانی (فـرض) ەکـان، "نوێـژ، ڕۆژو گرتن، زەکات دان، حـەج کـردن، جیهـاد" لەلوتکـەی کارە خێرەکـانن، هـەروەها گوێڕایـەڵی و بەدەمـەوە بـونی دایك و باوك، دەستپاکی و کاسپی حەلاڵ.
بـزانن کـەکاری خێـر یـەك ئاراسـتەی هەیـە، لەدڵـەوە دەردەچـــێت و جەنگەڵـــستانی (نفـــس) دەبـــڕێ و لەئەندامەکانـــدا بەشـــێوەی کـــردار دەردەکـــەوێت. واتـــا

بەپێچەوانەوە ڕو نادات. ...سوجدە بردن بێ ئامادەبونی دڵ سوجدە نیە لای خوا.

لەفیکری ئیسلامیدا زەمی دنیا کراوە، هەندێك خوشك و برا دوخاڵی گرنگیان بۆ ڕون نەبۆتەوە لەم (زەمی دنیا) یەدا، ئەویش :

ویستی دنیا بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی خەلافەت، ئەنجامدانی ئەرکی مرۆیی و کۆمەڵایەتی. ئایا راستە ئەمرۆ کەسێك بیەوێ وەك مرۆڤێکی سەردەم بژی بەلاَم تەلەفۆنێکی نەبێ ؟یاخود لانەیەکی نەبێ تیایدا بحەوێتەوە ؟یان کارێکی نەبێ بژێوی ماڵ و منداڵی دەربکات ؟ کەواتە هەر هۆکارێکی دنیا بۆ بەدیهێنان و بەمەبەستی جێبەجێکردنی ڕۆڵی مرۆڤایەتی مرۆڤ پێویستە. . ئیسلام دژی نیە.

کەواتە: ویستت بۆ دابین کردنی ئەپارتمانێك"شوقەیەك"، سەیارەیەك، هاوسەرێك، ئیشێك. ..لەپێناوی هەڵسان بەئەرکە شەرعیەکانت،

ویستێکی مەشروع و پێویستە. هەندێك کەس لەوانەیە بڵێن دنیا بەهێزەو کار ئەکاتە دڵمان، منیش دەڵێم راستە. بەڵام لەکاتێکدا خۆتی بۆ شل بکەیت و بێ قەڵغان بیت. ئەی بۆچی ڕۆژانە خوای گەورە بانگمان دەکات بۆ پەیوەندیکردن ؟ بەڵێ (٥) جار لەڕۆژێکدا دەبێت ئەو دڵە بخەیتە ڕوی ڕەحمەتی خواوە تا تەپوتۆزی ئەو ڕۆژەی لەسەر لاچێ (٥)جار. .(٥)جار...ڕۆژانە.

جابڕوانە، ئەوەی نوێژ ناکات دنیا چەند ئەزیەتی دڵی داوە.

خۆشەویستی دنیا، ئەمەیە قەدەغە لێکراوەکە، ئەمەیە قێز لێکراوەکە، بۆ؟ چونکە چەق و سەنتەری عیبادەت و هەمو کارێکی خێر(دڵە ). دڵیش دەبێت تایبەت بێت بەپەروەردگارەکەی. بەکورتی : هەر خۆشەویستیەك دورت بخاتەوە لەخوا.. ئەوە دەبێتە خواوەندت، پەنا بەخوا.

لەوانەشە هەندێك كەس بڵێن :خواش دەپەرستم و دنیاش دەخەمە دڵمەوە !! ئەم قسەیە زۆر هەڵەیە، چونكە خوای متعال دەفەرموێت ﴿ما جعل الله لرجل من قلبين في جوفه ﴾ "الاحزاب :٤" هەروەها ئەو نەمامەی خۆشەویستی دنیا لقی پیسی لێدەبێتەوە، وەك، حەسودی، رەزیلی، گوێ نەگرتن لەبەرامبەر، تەماع، هەمو ئەم فەسادە رەوشتیانە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی دنیا، هیوادارم سود وەرگرن و بێ بەشمان نەكەن لە دوعای خێر.

خوای متعال لەسورەتی الاحزاب دا دەفەرموێت :

﴿ والذاكرين الله كثيرا واذكرات أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما ﴾واتە: خوا لێبوردن و پاداشتێکی گەورەی ئامادەکردوە بۆ ئەو موسڵمانانەی کەزۆر زیکری خوا دەکەن (لەنێرو مێ).

بنەمای ئەم خواپەرستیە (ذکر)ە کە نشینگاکەی لەدڵدایە، نیمکەتی ئەو دڵی بڕواداره واتە: پەرستشێکی تایبەتە بە دڵ و دەرون (عیبادەتێکی قەلبیە). کەواتە بیرکردنەوە لەهەر ناوێك لەناوەکانی خوا (زیکرە).

صەڵاوات لەسەر گیانی پاکی رسول اللە (زیکرە) چونکە داوا لەخوا دەکەیت صەڵاوات و بەرەکات بڕژێنێت بەسەریدا.

هەر پەیوەندیەك لەگەڵ خوادا (زیکرە) وەك : نزا"دعا"، داوای لێبوردن، داوای بەهەشت، داوای حەڵاڵ، داوای لێخۆشبونی خوا بۆ یەکێك، داوای شیفا بۆ موسڵمانێك، داوای خێر بۆ خۆت یا بۆ موسڵمانێك، داوای

دورخستنەوەی شەڕو بەلاّ لەخۆت وموسڵمانان. ..ئەمانە هەموی زیکر و هۆکارن بۆ وەرگرتنی لێبوردن و پاداشتی گرنگ لەلایەن خواوە. خوا خۆی بڵێ (پاداشتی گرنگ !!!) جا بیر بکەرەوە دەبێت چەند گرنگ و گەورە بێت. ئەوەندە گەورەیە پێغەمبەری نازدارمان صلی الله علیه وسلم بەپێوەرێکی داناوە زیندو مردوی پێ جیادەکرێتەوە، دەفەرموێت ﴿ مثل الذی یذکر ربه والذي لایذکر ربه مثل الحي والمیت ﴾ "رواه البخاری" واتە: ئەوکەسەی کە خوای لەیادە و ئەوەی لە یادی نیە وەك جیاوازی نێوان زیندو و مردو وان.

نزا و دوعا لوتکەی هەموو جۆرەاکانی زیکرە، ئاگادار بەو غافڵ مەبە لەم خالاّنە :

١. بە ستایشی پەروەردگار دەست بە دوعاکەت بکە.
٢. پاشان داوای سەلاّواتی خوا بکە بـرژێ بەسەر پێغەمبەر دا.
٣. بەدڵێکی پڕ بڕوا بە وەلاّمدانەوەی خوا، داوا بکە.

٤. دڵنیابە کە دوعاکەت وەرگیراوە، بەڵام چۆن و کەی پەروەردگار وەڵامت دەداتەوە ؟ئەوە لەحیکمەتی خوایەو ئێمە نایزانین.

٥. دڵنیا بە کە خوای متعال هەمیشە خێری تۆی دەوێ.

٦. هەر لەتوانای زاتی الله یەکە دوعایەکت بۆ ئەنجام بدات. ئامەن. .ئامەن. .دڵت ڕونەکاتە ئەم و ئەو.

﴿ ان الله نفحات الا فتعرضوا لها ﴾[1] خوای متعال (هەرچەندە قاپی ڕەحمەتی والآیە و دانەخراوە) بەلآم بەشێوەی تایبەت دەینێرێت، بەشێوەی سروەیەك یان شنەیەك بەهۆی " جوانی و ئیخلآصی کردارێك " یاخود بەهۆی پاکی کەسێك، پیرۆزی کەسێك، ناڕەحەتی کەش و بارو دۆخێك، ستەم لێکردنێك.. رسول اللە (صلی الله علیە وسلم) ئەفەرموێت :خۆتانی بخەنە بەری.

ئەو شنەیە (نفحات)ە ژەنگی دڵ لادەبات.

ئەو (نفحات)ە لاوازی روح ناهێڵێ.

ئەو (نفحات)ە تەمەڵیی دەکاتە هیمەت.

---

[1] ئەم فەرموودەیەم بەم مەتنە دەست نەکەوت ئەوەی بەردەستم کەوتووە لەسەر ئەم چەمکە ئەمەیە: ئەنەسی کوڕی مالك "رەزای خوای لێبێت "دەگێڕێتەوە پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم ئەفەرموێت: «افعلوا الخیرة دهرة وتعرضوا لنفحات رحمة لله فان الله نفحات من رحمته .. ...» لە زنجیرەی صحیحی شێخ ئەلبانی دا ژمارە (١٨٩٠)ی فەرموودەی (حسن) ی پێدراوە . ع.شاسواری

ئەو (نفحات)ە ئاسۆی بیرکردنەوە بەهێزو فراوان دەکات.
دەبێتە هۆکارێك بۆ هیدایەت و پتەوکردنی ئیمان.....

فرسەتێکی گەورەیە بۆ قبوڵ بوونی دوعا.. زەکەریا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێ) زۆربەی کات لەمیحرابدا بوو، نوێژی دەکردو دەپارایەوە لەخوای مەزن، بەڵام کاتێك لە مریەمی پرسی ﴿سەلامی خوای لێ بێ﴾ : ئەی مەریەم، ئەمەت لەکوێ بو؟

مەریەمیش دەفەرموێ : ئەمە لەخواوەیە، خوا ڕزق دەبەخشێ بەویستی خۆی بەبێ حیساب.

زەکەریا زانی ئەوە کاتی (نفحات)ی خوایە، هەر لەو شوێنەدا پاڕایەوە لەخوا کە کوڕێکی پێبدا کە میراتی زانست و نهێنی پێغەمبەرایەتی پێببەخشێ و پاش دوعاکە ی نوێژی کرد، لەنوێژەکەیدا مژدەی کوڕی پێدرا، (فرشتەکان پێیان راگەیاند بەدەنگ !!!)خوا کوڕێکت پێدەبەخشێت دەبێتە پێغەمبەر ﴿ فنادته الملائكة وهو قائم يصلي في المحراب ان الله يبشرك بيحي

مـصدقا بكلمـة مـن الله وسـيدا و حـصورا ونبيـا مـن الصالحين﴾

ئايا كەی (نفحات) ی خوای متعال هەڵدەكات :

١.لەكاتی ئەوپەڕی ملكەچی"خشوع"دا.

٢.لەكاتی ئەوپەڕی گوێڕایەڵی "اطاعة"دا.

٣. لەكاتی خێركردندا بەدڵسۆزیەوە (اخلاص).

٤. لەكاتی سەردانی نەخۆشدا.

٥. لەكاتی ئارامش و خۆگریدا (صبر).

٦. لەكاتی لێبوردندا (العفو).

٧.لەكاتی دوركەوتنەوە لە گوناه.

٨.لەكاتی بەگوێكردنی دایك و باوكدا.

٩. لەكاتی وەرگرتنی زانست و بلاّو كردنەوەی لەبەرخوا.

١٠.لەكاتی دڵخۆشكردنی بێ باوكان و دڵشكاوان.

١١.لەكاتی بانگدا....

(نفحـــات)ی خـــوای گـــەورە زۆرە بـــەلاّم ئێمـــە كەمـتـــەرخەمیـــن...

دەگێڕنەوە، لەئاوەدانیەکدا پیاوێك هەبو نوێژی نەدەکرد و منالەکانیشی فێر نەدەکرد، بەلام بەهیچ جۆرێك زەرەری نەبو بۆ کەس.
ئەم پیاوە ئەجەلی دێت و هیچ کەس خۆی تێ ناگەیەنێت، بەلکو ناشیەلێن لەئاوەدانیەکەدا بەخاك بسپێردرێت. ناچار سێ کوڕەکەی دەیبەنە دەشت و چالێك بۆ باوکیان هەلدەکەنن، گەورەکەیان دەلێ وابزانم مردو ددبێ بشۆرێ. بەهەرسێکیان تەرمی باوکیان دەشۆن و پاشان یەکێکیان دەلێ وابزانم دەبێ نوێژی جەنازەی لەسەر بکرێ، بەلام ئەم نەگبەتانە نوێژە فەرزەکان نازانن چجای نوێژی مردوو !!
بڕیار دەدەن کە چاوەڕوان بن کە ڕێبوارێك ببینن و نوێژ بکات لەسەر جەنازەی باوکیان. پاش چەند ساتێك پیاوێکی دەشتەکی بەوێدا تێپەڕ ددبێ بەسەر حوشترێکەوە. بانگی دەکەن و حال و حیکایەتی خۆیانی بۆ باسدەکەن و لێی دەپاڕێنەوە کە نوێژی جەنازە لەسەر

باوكبان بكات .. كابراى دەشتەكى دەڵێ: وەى بەسەر چاو، نادەى لاى يەكەوە ريزبن بەرەو قيبلە.. خۆشى دەچێتە پێشيان واللە اكبر دەڵێ. .. پاشان بەخاكى دەسپێرن و كاكەى دەشتەكى جێيان دێڵێ.

شەو باوكى كوڕەكان دەچێتە خەوى هەرسێكيان و بەڕويەكى خۆش و بەزەردەخەنەوە دەڵێ ئامان ئامان نوێژتان نەفەوتێنن، يەكەم حيسابى قەبر لێپرسينەوەى نوێژە.

ئەوانيش دەڵێن : باوكە خۆ تۆ نوێژت نەدەكرد !!ئەى چۆن ئەوەها ڕوت گەشە ؟

باوكەش لەوەلامدا دەڵێت : من بەهۆى كابراى دەشتەكيەوە خوا لێم خۆش بو !!

ڕۆژ دەبێتەوەو هەركەس خەونى خۆى دەگێڕێتەوە بۆ يەكتر، دەبينن هەمان خەونيان ديوە. بڕيار دەدەن كە كابرا دەشتەكيەكە بدۆزنەوە و لێى بپرسن ئاخۆ هۆى چى بوە كە باوكيانى لەسزاى قەبر ڕزگارى بووە؟

هەرسێكیان دەچنە دەشت و چاومڕێی كابرا دەكەن و پاش ماوەیەك لەدورەوە پەیدا دەبێ، هاواری بۆ دەكەن و ئەویش دەیانناسێتەوەو بەرەو پیریان دێت. خەونەكانیانی بۆ دەگێڕنەوە و داوای هۆی لێخۆش بونی خوایی دەكەن بۆ باوكیان لە سایەی ئەو كابرا دەشتەكیەوە.

كابراش شەرم دەیگرێ ئەوانیش زۆر ئیلحاحی لێ دەكەن، پاشان دەڵێ :

ئازیزانم واللە من نوێژی جەنازە نازانم !!! بەلام كە ئێوەم دی بەو حاڵە زۆر خەفەتم بۆ خواردن و ڕیزمكردن و رومكردە قیبلە وتم: خوایەگیان تۆ خۆت ئاگاداریت كە ماڵ و خزم و سەروەتت نەداومەتێ، تەنها ئەم حوشترە نەبێ، قەسەم بە گەورەی ناوی زاتی تۆ ئەگەر ئەم مردوە بهاتایەتەلام بەمیوانی، حوشترە كەمم بۆ سەردەبڕی. ئەوا ئەو میوانی تۆیە و تۆش باشترینی باشترینەكانی ( اجود الاجود) ینیت و كەیفی خۆتە !!

خوایە گیان ئەی خاوەنی ڕوح و زاتمان، دنیامان پیشان بدە بەو شێوەیەی پیشانی پیاوچاکانی دەدەیت، خوشك و برای خوێنەرم: چی تێ ئەگەیت لەم باسەی خوارەوە :حەسەن و حسێن نەخۆشکەوتن و باوك و دایکیان نەزریان کرد کە ٣ڕۆژ بەڕۆژو بن بەنیەتی چاکبونەوەیان.

باوکیان علی کوڕی ابو تالبە (سەلامی خوای لەسەر بێ) و دایکیشیان (فاطمة)یە سەلامی خوای لێبێت. کچی رسول اللەیەو دایکی (امام) پێشەوا پێشەنگەکانە، ئەو بڕە گەنمەی هەیانبو بەشی ٣نان دەکات. وتیان بەسمانە بۆ ڕۆژو شکاندنمان، ڕۆژی سەرولەتێك ئەخۆین. .ڕۆژی یەکەم بەشی نانێك هەویر شێلراو برژێنرا بۆ بەربانگ .. لەکاتی بەربانگدا پیاوێك لەدەرگای داو وتی : ماڵەکە... هەژارم برسیمە!!علی (سەلامی خوای لەسەر بێت ) فەرموی:(فاطمة)هەژارەو برسیەتی ؟فاطمة (سەلامی خوای لێبێت) فەرموی: نانەکەی بەرێ ئێمە

هەر ئاوەکە ئەخۆین اابەم شێوەیە ڕۆژوی یەکەم ڕۆژیان بردە سەر. لەڕۆژی دوەمداو لەکاتی بەربانگدا، بێ باوکێك لەدەرگایدا ااا کولێرەی دووەمیشیان پێدا ااو تەنها ئاو خۆراکیان بو اااڕۆژی سێهەم تەنها ئەو بڕەیان مابو کە یەك کولێرەی لێ دروست دەبێ (حسن و حسێن شیرە خۆرەن) ڕۆژی سێهەمیش ئەسیرێك لەدەرگای داو دواکولێرەش درا بەئەو ااا بەلاَم "الرزاق" "البصیر" چاوی لێیانەو ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە تاڕۆژی دوایی موسلْمانان بیخوێنن و دەرسی لێ وەرگرن ﴿ویطعمون الطعام علی حبه مسکینا ویتیما واسیرا ﴾ بۆ ئەم قوربانیدانە"تضحیة"یە ؟وەلاَم ﴿انا نخاف من ربنا یوما عبوسا قمطریرا﴾. . لەخوا دەترسین پاداشتی ئەم ترسە چی بو ؟ وەلاَم

﴿فوقاهم الله شر ذلك الیوم ولقاهم نظرة وسرورا ﴾ پاداشتەکەی ڕزگاربون لە ناڕەحەتی قیامەت و بەرکەوتنی تیشکی شەوقی بینینی خواو فەرەحی هەتا

هەتایی. ئەمە دەرسێك بۆ لەقوتابخانەی ئەهلی بەیت "سەلامی خوایان لەسەر".

پێغەمبەری ئازیز (درودی خوای لەسەر) لەهاودڵانی خۆی پرسی سەبارەت بە (ڕەحمەت)، ئەوانیش فەرمویان :ڕەحمەت ئەوەیە کە ڕەحممان هەیە بەسەر منال و خێزانمان و کەس و کارمان و..... رسول الله (درودی خوای لەسەر) فەرموی: ئەو جۆرەم مەبەست نیە. مەبەستم ڕەحمەتی گشتی یە. پێویستە موسڵمانان ڕەحمەتەکەی هەمو مرۆڤایەتی بگرێتەوە بەڵکو بگاتە ئاژەڵ و ڕوەکیش.

بە داخەوە ئەمڕۆ بازرگانی دەکرێ بەسەر ئومەتی ئیسلامەوە و ئەم چەمکەمان پێ دەفرۆشنەوە !! ئەمڕۆ فیکریی رۆژئاوا داوای چاندنی چەمکی بەزەیی و لێبوردن لەگەلانی موسڵمان دەکات !!! سبحان الله ئیسلام پێش چواردە سەدە ئەم چەمکەی چاندوە لەوێنای (تصور) گەلانی ئیسلامدا. پێغەمبەری ئیسلام ( درودی خوای لەسەر) بەوردی ئەم رەوشتانەی بڵاوکردوە، بەجوانیش وەرگیران لەلایەن ئومەتەکەیەوە بۆ نمونە :

١. لەقورئاندا خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ خلقكم من نفس واحدة ﴾ واتە: هەمو مرۆڤایەتیمان دروست کردووە لە تاقە نەفسێك .. ئەمە زەنگی یەکسانی مرۆڤایەتیە.. واتە، هەمووتان یەکسانن، کەچی ئێستا گەلانی ڕۆژئاوا باسی یەکسانیمان بۆ دەکەن !!لاحول ولا قوە الا بالله.

٢.پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرمویەتی :(هەرکەسێك ئەشکەنجەی بەندەی خوای بدات ئەشکەنجەی ئەدەین)، کەچی هەڵمەتی دژایەتی ئەشکەنجەدانی مرۆڤ لەغەربەوە بۆمان دێت ؟ئایا ئەمە جێی داخ نیە ؟

٣.هەلگرەکەی پەیامی خوا، حەزرەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: (دخلت امراه النار في هره..) خوای متعال ژنێکی خستە دۆزەخەوە بەهۆی پشیلەیەکەوە !!بۆ ؟ چونکە نانی پێ داوەو نەبەرەلای

کرد تانان بۆ خۆی پەیدا بکات. بەلام ئەمرۆ باسی بەزەیی و مافی ئاژەلمان بۆ دەکەن !!

جارێکیان رسول الله (درودی خوای لەسەر) کۆترێکی بینی پەشۆکاو باڵە فڕێ یەتی لەتاو بەچکەکانی کە نەماون لە هێلانەکەیدا، فەرموی {من فجع هذه بولدها؟} کێ ئەمەی تۆقاندودو منالەکانی لێ دورخستۆتەوە ؟

٤. تەنانەت سەربڕینی ئاژەل ئادابی خۆی هەیە وەك: سەربڕین بەچەقۆی تیژنەبێ ، نابێ ئەو ئاژەلە خوێن ببینێ، نابێ چەقۆی قەسابەکە ببینێ، نابێ چاوی لەسەربڕینی ئاژەلی تربێ . جارێك پێشەوا عومەری کوڕی خەتاب یەکێکی بینی مەڕێك رادەکێشێ لەقاچیەوە بۆ سەربڕین پێی فەرمو : ئایا ئەتەوێت دوجار بیکوژێت ؟

رەحمەت لەفیکری ئیسلامیدا هەرگیز لەئەقل جیانابێتەوە، سەرەتای هەیەو کۆتایی نایەت و دەبێ وەك

هەمو رەوشتێکی پەیداکراو کاری بۆ بکرێت لەپێناو چاندنی لەدڵدا. چەند هاوەڵێکی رسول الله (درودی خوای لەسەر) سکالای کەم رەحمەتیان کرد واتە (دڵ رەقی)، رسول الله ئامۆژگاری کردن کە، دەست بهێنن بەسەر سەری هەتیوداو نان بەفەقیر بدەن، رەقی دڵتان نامێنێ و مرازتان دێتە دی. هەروەها خوێندنی قورئان و چونەلای نەخۆش و سەردانی گۆڕستان و چاکە کردن و یارمەتی لێقەوماوان و دڵشکاوان و کەم ئەندامان ... ئەمانە دڵنەرم ئەکەن و ئاسۆی چەمکی رەحمەت لەوێنای ئاخمانا فراوان دەکەن. با رەحمەت ببەخشین بەڵکو خوای ارحم الراحمین رەحممان پێ بکات. ..آمین آمین.

باوەڕهێنان بەوەی کە بابەتی رزق و رۆزیمان براوەتەوە لای خوای متعال، مەسئەلەیەکی ئیمانی گەورەیە و زۆر زۆر پێویستە تێی بگەین. دەگێڕنەوە کە لەزەمانی بایەزیدی البسطامی دا (رەحمەتی خوای لێ بێت) پیاوێك هاتە خزمەتی و لەسەر دەستی ابو یەزید تەوبەی کرد. کابرا (کفن دز بو). خەڵکی لێیان پرسی هۆی تەوبەکردنەکەی چی بوو ؟ کابرا وتی: زیاد لەهەزار گۆڕم هەڵداوەتەوەو کفنەکانیانم دزیوە (هیچیان ڕویان بەردو قیبلە نەبوە )!! تەنها لەم دواییەدا دوانیان رویان لەقیبلە بوە و سامیان هەبوە و کاریان تێکردم کە تەوبە بکەم.. خەڵکی پرسیاریان لە ابو یەزید کرد: ئاخۆ هۆی ئەوە چیە؟ (چونکە هەر مردویەك کە بەخاك دەسپێررێت ڕووی لە قیبلە دەکرێت) ابو یەزید فەرموی : ئەوە هی گومان کردنە لەم تێگەیشتنە راستەقینە کە ﴿رزق لای خوایە و لەئاسمانە، خەڵکی لەزەویدا بە شوێنیا دەگەڕێن﴾ چونکە خوای گەورە دەفەرموێت

﴿وفي السماء رزقكم ﴾ واته: رزقتان وا لەئاسمان. تەواو دەبێت باوەر بکەیت و تەسلیم ببیت بەو راستی یە.

کاتێـك عـەرەبێکی دەشـتەکی دەرونپـاك ئـەم ئایەتـە دەبیستێت ﴿فورب السماء والارض انـه لحق مثلما انکم تنطقون﴾ واته: قەسەم بەخاوەنی ئاسمان و زەوی ئەمە هەقـە (بـوونی رزق لـەئاسمان) کـابرای دەشـتەکی وتـی: ئەمـە چ ناپیاوێـك خـوای گـەورەی تـورەکردوە تـاخوای گەورە سوێند بەزاتی خۆی بخوا ؟خوشك و براکانم، واتێ مەگەن کەمن هانتان دەدەم پاڵی لێ بدەنەوە و کارنەکەن و شوێنی هۆکار نەکەون. هـەرگیز ئـەوە مەبەستم نیـە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە ئاممان گومانت نـەبێ لـەوەی کە رزقمان لای خوایە، بیرت ئەخەمەوە کـەخوای متعال فەرمانی کردووە بە هەوڵدان بۆ پەیداکردنی ڕزق، بەلام:

١.هەوڵدان وەك واجبە بەلام دەوری نیە.

ئەی بۆ هەوڵ بدەین ؟ چونکە دەبێ ڕێز لـە گرتنەبـەری هۆکـاری حـەلاڵ بگـرین. کـەخوا پیـشەیەك ئـەکات

بەنسیبت، یان دوکانێك، کارێك ...هتد ڕێز بگرە لەو دانانەی خوا بۆت.

٢. خودی هەوڵدانەکە (زاهیرە، ڕەسمێکی دەرەکی یە) بڕیارو ویستی خوا بنەمای مەسەلەکەیە، کەپەیوەندی نەکەیت بەکەسێك بۆ دامەزراندنت لە فەرمانگەیەك یان هەر بەرژەوەندیەك و وابزانیت ئەوکەسە نەتوانێت (بەخودی خۆی) خێرت پێ بگەیەنێت، ئەوە سەقەتیەکی ئیمانە تیاتداو وێرانی تەوەکولتە، خێرا تەوبە بکەو تەوەکول و پشت بەستنت راستکەرەوە.

هیوادارم سودت لێ وەرگرتبێ لەبابەتەکە.

## بەشی (١)

سەرفرازی موسڵمان لە "انفاق"(بەخشش لەپێناوی خوا) دایە..ئەگەر نازانی بزانە: بەخشش(بەخشین) ی پارە بەشێکی بچوکە لەبازنەی چەمکی بەخشش. بەخششی رەنج، بەخششی زانست، کات، هەست، گیان...ئەمانە هەمووی نمونەن بۆ جۆرەکانی بەخشش.

نەفس سروشتی وایە کە (ملکەچی) ناکات بۆ غەیری خۆی، حەز بەژێردەستەیی کەس ناکات، تەماشای دڵ و عەقڵ دەکات و هەوڵ دەدات فێڵیان لێ بکات !! بەڵام: کەزانی مەسەلەی جددیە بڕیاری کۆتاییە تەسلیم دەبێ و وەك هەموو بڕیارێك کە مرۆڤ دەیدات.. تەشبیهی بکە بەئەسپێکی کێوی کە نایەڵێ کەس سەرکەوێتە سەر پشتی، بەڵام: بەهەوڵدان و مەشق پێکردنی ڕۆژانە رەوشتی ئەو ئەسپە دەگۆڕێ. نەفس بەشی (زەوی)یە لەپێکهاتەمان، بۆیە داوای شتی نزم دەکات. ڕۆح بەشە (ئاسمانی)یەکەیە لەپێکهاتەمان، بۆیە داوای بەرزبونەوە

دەكات، كەواتە ململانێ لەنێوان نەفس و ڕۆحدا مەحاڵە ڕونەدات. بڕوانە ئەنجامدانی (فرض)، بۆچی (ثواب)ی زۆر زۆر زیاترە لەئەنجامدانی سوننەت؟ چونكە ئەنجامدانی (فرض) ویستی نەفس بەتاڵ دەكات و نەفس زۆر ناڕەحەت ئەبێ، لەبەر ئەمە خێری زۆرە. بەڵام ئەنجامدانی سوننەت بواری بڕێك لە ئازادی دەهێڵێتەوە بۆ نەفس، بۆیە خێری كەمترە.

"نەفس" ئەگەر بەشی خۆی تیا نەبێ دژ بەهەمو جۆرەكانی بەخشین دەوەستێ. "نەفس"حەز بەبەخشین دەكات ئەگەر دەسكەوتی هەبێ وەكو ریایی "ئەمە دەستكەوتی نەفسە"، چونكە پیاهەڵدان خەڵكی بۆ نەفس ناوبانگ پەیداكردنە بۆی و لەزەت وەرگرتنە لەو پیاهەڵدان و ناوبانگە....

خواناسەكان (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ) لەهۆكانی هەڵسوكەوتی نەفس تێگەیشتون و نەخۆشیەكانی نەفسیان دۆزیوەتەوە و ئاشكرایان كردوە بۆمان وەك

"الشح"(چڵێسی) ، واته: (جليس النفس) حـەز لێکردنـی کۆکردنەوەو دەست بەسەراگرتن و بڵاونەکردنەوەی شتی مەعنـەوی بـۆ نمونـە: حـەزلێکردنی سـومعەو ناوبـانگ، لەهـەمان کاتـدا حـەز ناکات کەسانی تـر ستایـشبکرێن و خـەڵك بەباشـی ناویـان بهێنـنّ !! لـەبواری مادیـدا نەخۆشـیەکە پێـی دەڵـێن "البخـل" واتـە: رەزیلـی. بەرنامـەی پیـاو چـاکان بـۆ کەمکردنـەوەو لـەناوبردنی دەسـەڵاتی نـەفس بریتـی یـە لـە بـە قۆنـاغکردنی پـەرومردەی نـەفس و رزگـار کردنـی لـە نەخۆشـیەکانی. چاوەڕوانی دوعاتانم.

## بەشی -٢-

خوێنەری ئازیز، بیرت ئەخەمەوە کە نەخۆشیەکانی (نەفس) زۆرن و مەبەست لەچارسەرکردنیان ئەوەیە کە ڕێگەی ( اخلاص ) ئاسانبکرێت بۆ ناو دڵ.

اخلاص واتە: (کردار بە پوختی ئەنجام بدرێت بۆ خوای گەورە).

اخلاص: مەرجی سەرەکییە بۆ قبولکردنی کردار لەلایەن خواوە. هەر لەبەرئەم (مەبەستە گەورەیە) پیاوچاکان دژایەتی نەفسی خۆیانیان کردوە. تیشکێکی کز ئەخەینە سەر نەخۆشی ( الشح ) (چڵێسی) . واتە: ڕەزیلی لەبواری مەعنەویدا. هەر کاتێك پێت ناخۆش بوو بەباشی باسی هاوکارێکت (هاوپیشەت) بکرێ. ئەوە ( شح ) (چڵێسی) ت تیایە ئاگاداری خۆت بە.

ئەگەردکتۆریت. مامۆستایت. گوتاربێژیت. قوتابیت. قورئان خوێنیت، ئاسنگەریت، وەزیریت... و ستایشی کەسێك کرا کەپیشەکەی وەك پیشەکەتە و پێت ناخۆش

بـوو ئـەوە دەبـێ چـارەی خـۆت بکـەیت، خواناسـان دەفەرموون: ئەبێ هەست بەخۆشی بکەیت!! ئینجا دەلێلە کە ( شح ) (چلێسی) ت نیە!!

بۆ رێگا چارەی ( البخل ) واتە، چارەسەرکردنی رەزیلی (بواری ماددی) سەرفکردنی شتی بەکەلك بۆ کەسانێك کە پێویستییان بەو شتە هەیە. ئەم سەرف کردنە بێ گومان کارێکی قورس و ناخۆشە بۆ نەفس و هەرگیز نەفس رێگە نادات بە بەخش، چجای بەخششی شتی چاك و بەنرخ و نازدار. پیاوچاکان بەرنامەیەکی جوانیان بۆ ئەم دەردە داناوە کە پێویستەلەمێشکدا بچێنرێت.

١- موڵك (هەموو موڵکێك، تەنانەت خۆیشت) موڵکی خوایە. ﴿لله ملك السموات والارض...﴾

٢- خوا سبحانە وتعالى پێویستی نیە بە بەخششی کەس.

٣- هەرچی دەبەخشی بۆ قیامەتی خۆت هەوڵ ئەدەیت.

٤- بەخشش نابێ بەمنەتەوە بدرێت. ﴿ قول معروف ومغفرة خير من صدقة يتبعها اذى والله غني حليم﴾،

واتە، بە وشەی شیرین هەژارەکە بەرێ بکەیی چێتری زیاترە لەوەی پارەی بەمنەتەوە بدەیتێ !!

٥ بەخشش دەبێ لەبەرخوا بێت (بۆ خوا، لەرای خوا بێت )، ئەگینا خوا وەری ناگرێت، ئەگەر بەبڕی لەتە وردیلەیەك (مثقال ذرة) نییەتەکەت بێجگە لە خوابێت (بەشی نەفس)، ئەوا خوا وەری ناگرێت و بەبەخشش حیساب ناکرێ.

٦- کاتێك کە شتێك دەبەخشین، یەکەم جار دەچێتە دەستی خواوەو پاشان دەچێتە دەستی هەژارەکە.

٧- کەواتە بێ شەرمییە شتی بێ کەڵك ببەخشرێت، ١٢ کراست هەیە تەنها یەکێکیان عەیبدارە، دەچیت ئەویان دەدەین بەخوا!!! ئەوانەی دەگەنە پلەی (الابرار) بە بەخشینی شتی گران و نازدار دەگەنە ئەو پلەیە، خوای متعال دەفەرموێت: ﴿لن تنالوا البرحتي تنفقوا مما تحبون﴾.

٨- بێ شەرمییە وا تێ بگەین کە ئێمە خاوەن مولکێکین (بەئازایەتیو بازووی خۆمان دەستمان کەوتوە)، دابەشکردن ونیزنو ویستی خوا نەخوێنینەوە.

لێرەدا ئەوەستین و داوا ئەکەین لەپەروەردگار کار ئاسانیمان بۆ بکات لەرزگاربونمان لەهەمو دەردەکانی نەفسمان..... امین

## بەشی "٣"

تێبینی بکەن: زۆربەی نەخۆشیەکانی (نەفس) لەچوارچێوەی (خۆویستی)وە هەڵدەقوڵێن. هەر وەها پێویستە بزانین کە نەخۆشیەکانی (نەفس) سەر چاوەی ڕەوشتی خراپن.

لەبەشی دووەمدا ئاماژەمان بەوەدا کە ئەگەر خەڵکی ستایشی کەسێکیان کرد کە ( پیشەکەی هاوشێوەی پیشەکەت بوو) پێت ناخۆش بو... بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕزگارت نەبوە لەنەخۆشی (چڵێسی) واتە: (الشح) (چڵێسی). ئەو هەستە چۆن چارەسەر ئەکرێت؟

١. بە داواکاریی لێبوردن لەخوای گەورە.
٢. بە دیاری ناردن بۆ ئەو کەسە چونکە دیاری ناردن قین و رق ئەڕەوێنێتەوە ( تهادوا تحابوا).
٣. ئەگەر ئاشی ناسیت دوعای بۆ بکە.

بەم شێوەیە ئەو هەستە نامێنێت ان شاء الله. نەخۆشی (نفس) وەك نەخۆشی (لەش) وایە، نیشانەی هەیە، بەو

نیشانانە پزیشك نەخۆشییەکە ئەدۆزێتەوە، ئێمەش دەبێ ببینە دکتۆری خۆمان و دەردە (نەفس)ییەکانمان بدۆزینەوە و چارەسەریان بکەین.

هەندێ نیشانەی نەخۆشی ( نەفس):

١- ( بەکەمزانین)ی بەخششی خەلکی.

٢- ( بەزۆرزانین )ی بەخششی خۆت.

٣- ( هەستکردن بەناڕەحەتی)کاتێك دەبیستیت ( فلان) لەتۆ زیاتری بەخشیوە.

٤- ( هەستکردن بەخۆشی )کاتێك کە بۆت دەردەکەوێ کە بەخشینی تۆ زیاترە لە ( فلان).

٥- ( هەوڵدان)بۆ دۆزینەوەی بەخششی خەلکی.

٦- ( دڵخۆشبون)بەزەرمری خەلکی.

تێبینی : وەك وتمان بەخشش تەنها پارە نییە. بەم جۆرە بیر لەنیشانەی تر بکەرەوە کە تیاتدا هەیە چونکە کەس ناخت ناناسێت وەك خۆت.

زانایانی شەریعەت دەفەرمون مەبەستی شەریعەت دابین کردنی بەرژەوەندی مرۆڤە. ئەو بەرژەوەندیانەش لە ٣ ئاستدان:

١-ئاستی پێداویستیە سەرەکی یەکان: ( الضروريات) کە هەموو ئەوبوارانە دەگرێتەوە کە ژیانی لەسەر بەندەو بەبێ ئەوانە ژیان ناڕوات بەرێوە. ئەم پێداویستی یە سەرەکی یانە ( پێنج)ن.

أ-پاراستنی ئایین.

ب- پاراستنی گیان.

ج- پاراستنی ئەقڵ.

د- پاراستنی نەوە (نسل).

هـ- پاراستنی ماڵ..

بەبێ ئەم پێنج خاڵە ژیان مەحاڵە.

٢- ئاستی پێداویستی یە پلە دووەکان: ( الحاجيات)

ئەو بوارانە دەگرێتەوە کە خەڵکی پێویستیان پێیەتی و بەبێ ئەوانە ژیان قورس دەبێ، وخەڵکی دەکەونە

نارەحەتیـــەوە، وەك : (کارەبـــا)، (ئـــاو)، (دەرمـــان)، (تەلەفۆن)....

٣- ئاستی زیادەچاکی ( التحسینیات) بـریتی یـە لەو مـە سائیلانەی کە کار ئاسانی ئەکەن بـۆ خـەڵکی و هـەر کاتێـك نـەمان خـەڵکی نارەحـەت نـابن، بـەڵام ئـەو زیادەچاکیەیان لەکیس ئەچێ.

تێبـــینی : نمونـــەی ئاســـتی (٢) و (٣) ڕێژەییـــە، واتـــا بەگوێرەی کۆمەڵگایە.

دوکانی توحوفیـات ویانـەی ڕەشاقە.. لەهەنـدێ کۆمـەڵگا بەئاستی (٢) حسابە!.

چۆن ئەم ئاستانە دابین دەکرێن بۆ مرۆڤایەتی ؟

وەڵام : بۆ پاراستنی یەکەم دو مەرج پێویستە:

یەکـەم: یاسایەك کـە ئەرکـە ئیجبارییـەکانی سەرشـانی مرۆڤ دیاری بکات.

دووەم: یاسایەك کە کارە قەدەغە کراوەکان دیاری بکات.

بۆ ئاستی دووەمو سێهەم، پێویستیان بە یاسایەکە کە ئەوپێداویتسیانە بهێننە دی.

تێبینی: لەڕیزبەندی ( اولویات)دا، ( پێداویتسی یە سەرەکییەکان) پێش دەخرێنو پاشان( پێداویستی یە پلە دووەکان و پاشان پێداویستیە زیادە چاکیەکان).

سەبارەت بە (پێداویستی سەرەکییەکان): ئایین پێش هەموویانە، واتە: پاراستنی ئایین گرنگترە لەپاراستنی گیان (نەفس).

پاش پاراستنی ئایین نەفس دێت کاتێك ( دووگیانی) مەترسی دروست بکات لەسەر دایك، نابێ (حمل) بکا، واتە: نەفس پێش دەخرێت بەسەر نەوەدا. هەروەها نەفس پێش دەخرێت بەسەر ئەقڵدا (ئەگەر نەشتەرگەریەك لەپێناوی ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤێك بکرێت، بەلاّم پێشەکی بزانرێت کە زەرەرو زیان بەمێشکی ئەگات، ناچارە ( لەپێناوی مانی ژیانی ئەوکەسەدا) کەئەو زەرەرە بدات لەمێشکی چونکە

پاراستنی نەفس پێش نەقڵە. بەڵام پاراستنی نەقڵ پێش دەخرێت بەسەر نەوەدا، و دوای هەموویان لەگرنگیدا پارستنی ماڵ دێت. هیوادارم سودتان وەرگرتبێ لەم بابەتە. بەخواتان ئەسپێرم.

